# دیوانی بێسارانی







لێکدانەوە: حەکیم مەلا ساڵح

بیسارانی، ملا مصطفی، ۱٦٤۱-۱۷۰۲ میلادی.

دیوان بیسارانی/ ملا مصطفی بیسارانی، سنندج، گوران، ۱۳۷۵.

فهرستنویسی براساس اطلاعات فیپا.

چاپ: اول.

تیراژ: ۵۰۰۰ جلد.

چاپخانه: میهن.

تدوین و جمع‌آوری: حکیم ملا صالح.

ویراستار: حسین سبحانی.

قطع: وزیری، گالینگور.

تعداد صفحات: ٤۹٦ صفحه – زیرنویس.

شماره مجوز: ۱/٤٥٦۸-۱۳۵

۱/٤٥٦۸-۱۳۵-۷٥/۱۱/۱۰

کتاب مهرگان

**مرکز پخش:** سنندج، چهارراه شهدا، بازارچهٔ کتاب، کتاب مهرگان.

**تلفن:** ۲۲۲۵۲۵۹ -۳۲۸۸۸۹۷ ۸۷۱ ۹۸+



**قیمت: ۵۰۰۰ تومان**



دەردەدار کەسێن دەردش بۆنەسەر　　دودش کۆی بێستون بگێرۆ نەوەر
مـن زەریـۆ دەردم هـانە دەرون دا　　وەختەن (نەجد) بدۆ وە (بێستون)دا

« پیتی ـ ئەلف ـ»



« پیتی ـ بیٚ ـ»

## « پیتی ـ پێ ـ »



## « پیتی ـ تێ ـ »



## « پیتی ـ ثێ ـ »

## « پیتی - جیم - »



## « پیتی - چ - »

## « پیتی ـ حێ ـ »



## « پیتی ـ خێ ـ »



## « پیتی ـ دال ـ »

## « پیتی ـ ڕێ ـ »

## « پیتی ـ زێ ـ »



## « پیتی ـ سین ـ »

« پیتی ـ شین ـ »

« پیتی ـ غەین ـ»



« پیتی ـ قاف ـ»

## « پیتی ـ واو ـ»



## « پیتی - هیٚ - »

«پیتی -یا-»

# « بێسارانی »

( ١٠٥٣ - ١١١٣ ک ) - ( ١٦٤١ - ١٧٠٢ ز )

مەلا مصطەفای کوڕی مەلا قوطبەدینی کوڕی مەلا شەمسەدین. لە دایکبوی گوندی بێسارانەکە یەکێکە لە گوندە گەورەکانی ناوچەی ژاوەرۆ - خۆراوای شاری سنە.

لە ( نۆدشە ) و ( پایگەلان ) و ( سنە ) خوێندویە، جگە لەوەی کە سەرەتا لە خزمەت باوکیدا دەستی پێکردووە. زانستە ئیسلامیەکانی تەواو کردووە و بە مەلایەتی ژیانی بردۆتە سەر. تا لە تەمەنی ( ٦١ ) ساڵیدا ماڵئاوایی لە ژیان ئەکات و لە سەر وەصیەتی خۆی لە گۆرستانی (پیرەهەژارە) بە خاکی ئەسپێرن. کە ئەکەوێتە بەرامبەر ( سەوڵاوا )ی نزیک (مەریوان ).

بێسارانی لەوە ئەچێ نەوەی لێ بە جێ نەمابێ - ئەوەندەی سۆراخم کردبێ - بەڵام ژنی هێناوە هەروەکو لە شیعری ( قیبلەم دیم نەدیم )دا دەرئەکەوێ :

پەشتانی باڵات جاریٚ بیم نەبیم.

بەڵام دیارە تەمەنی ژن هێنانەکەی کورت بووە، هەروەکو هێنایێتی یا نەیهێنابێ.

هەردوو خوالێخۆشبوو ( عەلائەدین سەجادی ) و ( محەممەد بەهائەدین صاحب ) لە (مێژووی ئەدەبی کوردی ) و ( پیرشالیاری زەردەشتی )دا وایان دیاری کردووە کە باڵندەی عەشقی بە سەر گوڵباخی باڵای ( ئامینەی پایگەلانی )یەوە هێلانەی چێ کردووە.

کە چی شاعیر خۆی بە هیچ جۆرێ ناوی ( ئامینە ) ناهێنیٚ، بەڵکو :

١ - چەند جارێ ناوی ( شیرین ) و ( زلێخا ) دێنێ، کە ڕەنگە بە کینایە هێنابێ.

٢ - بەڵام لە شوێنێکدا بە ئاشکرا ناوی ( ئینصاف ) دێنێ. بڕوانە شیعری (جەمینش صافەن).

لە زۆر شیعری تردا شاعیر بەوشەی ( چراغ ) و ( قیبلە ) ناوی دڵخوازەکەی ئەشارێتەوە. کەچی نازانم بۆچی ناوی ( زلێخا ) و ( شیرین ) و ( ئینصاف ) بە ئاشکرا دێنێ؟.

بڵێی ئەم سیانە هەریەکەو لە سەردەمێکدا بە باوەشێنی نازوخۆشەویستی ئارەقی ڕێگای عەشقی بێسارانی یان سڕیبێ ؟.

رەنگە ئەم ناوانە هەریەکەو خەڵکی یەکێک لەو شوێنانە بووبن کە شاعیر بەهۆی خوێندنەوە ماوەیەک تێیاندا جێگیر بووە ( پایگەلان ) ، ( نۆدشە ) ، ( سنە ) . هەروەکو لە شیعرەکانی (نالی)شدا دەرئەکەوێ کە جارێک ( شارەزوور )ی کردۆتە میحرابی عەشق و جارێک (قەرەداغ). گرنگ ئەوەیەکە :

١ـ جارێ وای دیاری ئەکات کە ئەوەی ویستویەتی خواستویەتی. بڕوانە شیعری (قیبلەم دیم نەدیم ) .

٢ـ لە شوێنێ تردا وای دائەنێ کە بەدکارێ لە یەکی جیاکردوونەتەوە . بڕوانە شیعری (چراخم جیا ) . ( ڕەقیب سیا بۆ ) .

٣ـ جارێ بە پەیمان شکێنی ئەداتە قەڵەم. بڕوانە شیعری ( دڵە لاڵ خاسەن ).

٤ـ جارێتر بە پەیمان شکێن و بێ وەفا. بڕوانە شیعری ( چراغم وەفات ) .

٥ـ کەچی لە شیعری ( پڕ خومارشەن )دا بە پێچەوانەوە بە مەیل داری ئەزانێ.

٦ـ جگە لەمانە لە شیعری ( دەلیل نەزانان ) و ( بە بەرزانەوە ) دا خۆی بە دڵدارو ئەو بە بێ ئاگاو حاڵ نەزان ئەداتە قەڵەم .

## « بێسارانی و شیعری ڕۆمانتیک »

بە داخەوە ئەم لایەنە گرنگەی ئەدەبەکەمان ( ڕۆمانتیک ) تا ئێستە بەحەقی خۆی لە ئەدەبی کوردیدا لێکۆڵینەوەی چڕو پڕو بە پێزی لە سەر نەکراوە ، کە نەئەبوو بەم شێوەش بوایە ، چونکە ڕۆمانتیک بەشێکی گەورەو گرنگی ئەدەبەکەمانە .

وا هەست ئەکەم ئەمە ڕەگێکی مێژوویی هەبێ و ئێمە تا ئێستە پێی نەگەشتبین . ئەوەندەی من ڕێگەم پێ بردبێ لە ناو ئەدەبیاتە دیارەکانی دنیادا ، لە هیچ کامیاندا ڕۆمانتیک ئەوەندەی لای گەلی کورد ڕەگی قووڵ و تەمەنی درێژی هەیە وەها نیە . ئەمەش دەستکەوتێکی پڕ بایەخی مێژووەو پێوستە بەوردی سەرنجی بدەین و لێکۆڵینەوەی بە بڕشتی لە سەر بکەین .

لەم بارەوە وەکو مایەی شانازی و دڵخۆشکەر ئەو بەراوردەی کاک ڕەئوف عوثمانە لە نیوان ( هۆگۆ ) و ( مەولەوی تاوگۆزی ) دا کردوویەتی و ئەڵێ : وەک مێژوو نووسە جیهانیەکان ئەڵێن سەرقافڵەو گەشەپێدەری ئەدەبی ڕۆمانسی لە فەرەنسادا هۆگۆی بەهرەمەند بوو ( ١٨٠٢ ـ ١٨٨٥ ) دەئەم مێژووە تارادەیەک بەرامبەرە لەگەڵ لە دایکبوون و مردنی مەولەوی دا ( ١٨٠٦ ـ ١٨٨٢ ) واتە لە دایکبونی ئەدەبی ڕۆمانسی لە فەرەنساو لە کوردستاندا لە یەک کاتدا لە سەر دەستی هۆگۆ و مەولەویدا هاتەکایەوە ، کەواتە مەولەوی داهێنەرو گەشە پێدەری هۆنراوەی ڕۆمانسی کوردیە .)(١)

ئەم بەراوردە ئەوەندەی تیایە کە گەلی کورد لە گەڵ ئەو هەموو کەم دەستی و بوار لێ تەنینەدا هاوکات لەگەڵ وڵاتێکی ئازاد وپێشکەوتوی وەکو فەرەنسادا بۆنی هەڵاڵەی ڕێبازێکی ئەدەبی ی کردووە .

بەڵام خۆشتر ئەوەیە کە بەرلە مەولەوی شاعیرانی ترمان هەن بێ ئەوەی قوتابخانەیەکیان بە ناوی ( ڕۆمانتیک ) ناسیبێ ، زۆربەی هەرەزۆری شیعرەکانیان ئەچنە ئەوخانەیەوە .

بۆ نمونە ئەم شاعیرەی کە ئێستە واین لە خزمەت دیوانەکەیدا سەدەو نیوێک و دووساڵ بەرلە هۆگۆ تەقەی لە دەرگای ئەم مەسەلەیە داوە . وە یەک سەدەش لە پێشتر بووینەتە دەست پێشکەر، ئەگەر ئەو مێژووە بە یاد بێنینەوە کە لێکۆڵەرە ئەوروپیەکان دیاری یان کردووە و ئەڵێن : ڕۆمانتیک لەکۆتایی سەدەی (١٨) و سەرەتای سەدەی (١٩)دا سەری هەڵدا .

وە شایانی باسەکە ڕۆمانتیک لە ئەدەبی کوردیدا سروشتی یە ، بەڵام لە ئەوروپادا دەست کردبوو . لە سەر ئەوبنەمایە دامەزراکە دەستەیەک شاعیری ڕۆشنبیر دژی خوو ڕەوشتی شاعیرانی کلاسیک ڕاپەڕین ، واتە دژی ئەو ئەدەبەی کە لەکۆشک وتەلارەکاندا بەدەست نەجیب زادەکانەوە گیری کردبوو .

من دڵنیام بەرلە یسارانیش شیعری ڕۆمانتیکمان هەیە ، بەڵام بە هۆی کەشف نەبوونی

١ ـ کتیبی میهرەجانی مەولەوی ل ٩١

ئەدەبی کوردی یەوە بە تەواوی، ئەم مەسەلەیە هەروا ئەمێنێتەوە، تا بزانین ڕۆژبەرەوکوێ ئەچێ و مێژوو چی ترمان پێ خەڵات ئەکات. هەر لە ( مەولانادەردین ) و (یوسف )ی هاودەمی بێسارانیەوە بیگرە تا ئەو شاعیرانەی کە لە قوتابخانە شیعریەکەی (ئاڤێستا) و ( ماریفەت ) و (سەرەنجام)دا پێگەشتوون.

## کارتێکردنی لە سەر مەولەوی

مەولەوی یەکێکە لەو شاعیرە ڕۆمانتیکانەی ئەدەبەکەمان کە گەورەترین پەیوەندی بە شەپۆلی شیعری سەردەمەکەیەوە هەبووە و زۆربەی شاعیران لای ئەو زێڕەکانیان داوە لە مەحەک، وەکو ( بولبول ) ، (مەلاعەبدولای‌داخی ) ، ( شێخ عەزیز و شێخ عەبدولڕەحمانی جانەوەرە )، ( شێخ یوسفی نۆسمەیی ) ، ( مەحروم ) و هەندێکی تر. وە هەروەها لە دیوانەکەیدا دەرئەکەوێ کە ئاگای لە شیعری هەندێ لە شاعیرانی پێش خۆیشی هەبووە، وەکو ( مەولانا خالیدی نەقشبەندی ) و ( وەلی دێوانە ) و ( بێسارانی ).

ئەوەی لێرەدا جێگەی باس بێت بێسارانی یە. کە پێم وایە لە هەموو شاعیرێ زیاتر ڕەنگی لە سەر مەولەوی دارشتوەو بەمەش‌دا پلەی بەرزی‌ی بێسارانیمان بۆ دەرئەکەوێت. وەوابزانم زیادەڕەوی نەکردووە کە پیّ‌ی ووتوە (سەودایی کامڵ ) واتە دڵدارێکی ڕاستەقینەو تەواو.

وشەی ( کامڵ ) لە زاراوەی عیرفاندا واتە: ڕابەرو ڕێ نیشان دەرێک کەپلەی خودا پەرستی‌ی هێندە بەرزو بڵندبێ، هەرکەسێ دەستەوداوێنی بێ هەموو بەزم و ڕەزمێکی دنیا ئەخاتەلاوەو لە (حەق) نزیک ئەبێتەوە.

مەولەی لەگەڵ ئەوەدا کە بێسارانی لە ناو ئەو جوغزەدا ئەبینێ و بەوپایە بەرزەی ئەزانێ، بەیتێکیشی لە شیعرەکانی هێناوە و قەسیدەیەکی خۆی پێ قوفڵ کردووە. ئەڵێ.

| | |
|---|---|
| های ڕەحمەت ئەو قەبر سەودایی کامڵ | سەرمەشق مەینەت ( بێساران) مەنزڵ |
| « یانە وێرانی هەر وەمن ئامان | مەتاووگێرتەی کەسێوتەڕ دامان » |

وە لە شیعرێکی تریدا کە سکاڵا لە دەست دەردی پیری ئەکات، لە باخەکەی بێسارانیدا سێ دانە گوڵی بۆن خۆشی هێناوە و داویەتی لە بەرۆکی بوکی شیعرەکەی. بەرلەوەی دەست بەرێ بۆ گوڵەکان ئەڵێ:

مـوطریب بـۆ وە داد دڵگـیریمەوە پـیری هـا ئـاما وە پـیریمەوە
نـەوات وێرانـەی دڵ کـەرۆ ئـاوا چـەنی بـەستەی فـەرد بـێساران مـاوا.

لێرەدا مەولەوی بەو پەڕی دڵ لێچوونەوە ئاوازی شیعرەکانی بێسارانی لەگەڵ دەنگی ئەو موطریبەدا هاوتا ئەکات کە مەگەر هەرخۆی بزانێ چەند حەزی لە دەنگی کردووە. پاشان ئەم سێ بەیتەی بەرێز هێناوە کە ئەڵێ:

« ئینە گرد جە وەخت نـادانـیم بـیەن فەصڵی سەرمەستی و جـەوانـیم بـیەن
ئیسە هـا جـەگشت پـەشیمانیم بـەرد وادەی پـیریمەن جـەوانـیم ویـەرد
کـۆچ دوایـیمەن، یـاوانـم نـۆبـە نۆبەی تۆبـەمەن، کـەرەمدار تـۆبـە ».

وە لەوشیعرەیدا کە لە وەڵامی نامەیەکی (شێخ عەزیزی جانەوەرەیی)دا نوسیوویە، جارێکی تر پەنجەی ڕێزی خستۆتە سەر بێسارانی و ئەڵێ:

« خەم چەنی خەمان زوو مبۆساکـن بـێسـارانـییەن نـە تـۆی فـەردمن »

وە هەروەها لە شیعرێکی تردا کە لە وەڵامی نامەیەکی شێخی سیراجەدینا نوسیویە دوو بەیتی تری بێسارانی تێهەڵکێش کردووە، کە هەر ئەو دوو بەیتە شێخ لە گەڵ نامەکەیدا ناردوویە، وە کەسیشیان ئاماژەیان پێ نەکردووە کە شیعری بێسارانییەو ماموٚستا مەلا عەبدولکەریمیش بەسەریدا ڕەت بووە. سەیر لەوەدایە کە دیارە مەولەوی دیوانی بێسارانی خوێندۆتەوە، بەڵام چۆن بە شێخ ئەڵێ:

جه رِووی لوطفەوە ئینەت فەرماوان

بەمەش وای نیشان ئەدات کە شێخ فەرموویە . وە یا رەنگە هەر زانیبێتی کە شیعری بێسارانی یە، بەڵام لە ئاستی گەوەریی و رێزی شێخدا دەمی لێ نوقاندووە. دوو بەیتە کەش ئەمە یە:

« یا کاغەز برِیان ، یا مەلا مەردەن  یا خۆ عارتەن دۆس وەیاد کەردەن
غەمگین مەنیشە غەم بدەر وەباد  فەلەک نمازۆ کەس وە خاتر شاد » .

ئەمانە ئەو چەند بەڵگەیە بوون کە جێ پەنجەی بێسارانی لە سەر مەولەوی دیاری ئەکەن و ئەمەش تواناو دەستەلاتداریتی بێسارانی نیشان ئەدەن لە قەڵەمرەوی شیعردا .

وە دیارە جێ پەنجەی لە سەر هەندێ شاعیریتریش دیارە بە تایبەتی ( پیرەمێرد ) و (مەستورەی ئەردەلانی)، بەڵام ئێمە بۆیە نمونەمان لە سەر مەولەوی هێنایەوە چونکە لەوان شاعیر و ناودارترە .

## ئەو سەرچاوانەی کە سودیان لیّ وەرگیراوە :

١ ـ دەفتەریکی دەستنوسی ( مەلا محەممەد رەشیدی مەعدومی ) کە ( ٢٥٤ ) پارچە شیعرە و لە ٢٥ / شهریور / ١٣٥٨ی شەمسی کە مانگی هەشتی ساڵی ١٩٧٩ زاینی ئەکات لە نوسینەوەی بووەتەوە. ئەمە نوسخەی یەکەم بوو کە ئیّمە کارمان لە سەر کرد. ئەڵبەتە زەحمەتیّکی زۆری کیّشاوەو بە چەند ساڵ توانیویەتی پیّکی بیّنیّ. بەڵام دیارە دەستی بە هەندیّ شویّن نەگەشتوە، بۆیە ئیّمەیش لە دوای ئەو هەندیّکی ترگەراین و توانیمان (٤٨) پارچەی تری بە دەست بیّنین. وە ئەتوانم بڵیّم کە دوای ئەمەش هیّشتا ماویەتی تەواوی شیعرەکانی کۆ بکریّنەوە، ئەگەر نەبووبنە خۆراکی مۆریانەو گەردی رۆژگار، چونکە هەر وەکو دەرئەکەویّ بیّسارانی شاعیریّکی دەوڵەمەندو بە دەستەڵات بووە، بۆیە ناشیّ لەمە زیاتری نەبووبیّ.

مەلا محەممەد رەشیدیش هەر بەو بڕوایەوە لە پاشکۆی دەفتەرەکەیدا نوسیوویە:

(گر چە شاید باز تمام اشعار آن مرحوم بدست نیامدەباشد ).

واتە: ئەگەرچی لەوانەیە هیّشتا تەواوی شیعرەکانی ئەو خوالیّخۆشبوە بە دەست نەهاتبیّ.

بەڵام دڵنیابووە لەوەی کە زۆربەی هەرە زۆری شیعرەکانی گردکردوەتەوە. بۆیە بە دوایدا نوسیوویە : ( اما میتوانم ادعا کنم کە کامل‌ترین و صحیح‌ترین دیوان مرحوم بیسارانی کە تاکنون بە رشتۀ تحریر درآمدە ).

واتە : بەڵام ئەتوانم بڵیّم کە تەواوترین و دروست‌ترین دیوانی خوالیّخۆشبو بیّسارانی‌یە کە تا ئیّستە نوسراوەتەوە ).

ئەم دەفتەرە دیارەکە زەحمەتی زۆری لە گەڵدا کیّشراوەو نوسەرەکەیشی یەکیّکە لە هەوادارانی شیعری بیّسارانی، بەڵام لە هەندیّ شویّندا دوور نیە لە هەڵە و پەڵە و هەر وەکو لە جیّگەی خۆیاندا بە بەراورد لەگەڵ دەستنوسەکانی تردا ساخمان کردوونەتەوە.

٢ ـ دەفتەریکی دەست نوسی مامۆستا ( سەید طاهیری هاشمی ـ سها ـ ) کە ( ٢٦١) پارچە شیعرە و لە شەوی یەک شەمە ١٣٥١/١١/١ی شەمسی کە (٢٤) ساڵ لەمەوبەر ئەکات واتە ساڵی ١٩٧٢ی زاینی تەواوی کردووە.

ئەم نوسخەیەش لە بەر چەند دەست نوسێکی‌تر نوسراوەتەوە و دیارە ماموٚستای خوٚشەویست زەحمەتی زوٚری لەگەڵدا کێشاوە ، جگە لەوەی کە خوٚی بێسارانی ناسە ، کە تەواویشی کردووە داویەتە دەست ( مەلا عەلی صەبار )ی خواڵێخوٚشبو ، ئەویش بە سەریدا چووەتەوە و لە یەک دوو شوێندا بە خەتێکی سوور هەڵەگیری کردووە . پاشان ماموٚستا سەید طاهیریش دڵنیا نیەکە ئەو دەفتەرە تێکڕای شیعرەکانی بێسارانی بن ، هەر وەکو نوسیوویە : ( البته نمی‌توان مدعی شد که این مجموعه کلیۀ غزلیات بیسارانی را حاوی است ) .

واتە : ئەڵبەتە ناتوانم بڵێم کە ئەم کوٚمەڵە شیعرە هەموو غەزەڵەکانی بێسارانی ئەگرێتەوە .

ماموٚستا لە پاشکوٚی دەست نوسەکەیدا نوسیوویە : ( متأسفانه در سال ١٣٢٧ شمسی یکی از دانشگاهیان ( از ذکر نامش معذورم ) به منطقۀ ما آمد ، هر دو نسخه دیوان بیسارانی و یک نسخه خطی از دیوان نالی و چند نسخه دیگر از آثار شعراء کرد از من عاریه گرفت ، شخصی جوانمرد مذکور این بلا را تنها بسر من نیاورد بلکه از کرمانشاه تا مهاباد نزد هر کسی که آثار شعراء کرد را دید بعنوان عاریه از دستش درآورد ، این رهزن عالم ادبیات پس از مدتی دواوین شعراء کرد راکه به آن طراری بدست آورده‌بود با خود برداشته وبفرانسه رفت ، و داغ فراق نسخ گرانبها و نایاب بر دل صاحبانشان گذاشت . اکنون در پاریس از آنها استفاده میبرد و بریش کسانی که کتاب را عاریه میدهند می‌خندد ) .

واتە : بەداخەوە لە ساڵی ١٣٢٧ی شەمسیدا یەکێک لە قوتابیانی زانکوٚ ( حەزناکەم ناوی بەرم ) هاتە ناوچەکەمانەوە ، هەر دوو دەست‌نوسەکەی دیوانی بێسارانی و دەست نوسێکی دیوانی نالی و چەند دەست نوسێکی‌تری لە بەرهەمی شاعیرانی کورد لە من وەرگرت ، ئەو کوڕی باشە تەنها ئەم بەڵایەی بە سەرمندا نەهاورد ، بەڵکو لە کرماشانەوە تا مەهاباد لای هەر کەسێک بەرهەمی شاعیرانی کوردی دیبێ لێی وەرگرتوون و بردوویەتی ، ئەم دزی جیهانی ئەدەبیاتە پاش ماوەیەک کە ئەم دیوانی

شاعیرانی کوردەی کە بەو شێوە ساختە بە دەست هێنابوو ڕۆشت بۆ فەرەنسە. داخی دوور خستنەوەی ئەو دەست نوسە بە نرخ و نایابانەی چزان بە دڵی خاوەنەکانیاندا. ئێستە لە پاریس سوودیان لیٚ وەرئەگرێت و بەوانەش پیٚ ئەکەنیٚ کە لیٚی خواستوون)

مەبەستی مامۆستا لەو دوو دەست نوسەی دیوانی بێسارانی ئەو دووانەیە کە یەکەمیان هی مەلاعەلائەدینی کوڕی خواڵێخۆشبوو مەلاعەلی گلێنی و دووەمیان هی کاک عەباس خانی ئازادپور (سەرهەنگ ئازاد پوور)ە کە کاتی خۆی مامۆستا، بۆ ساخ کردنەوەی دیوانی بێسارانی لیٚی وەرگرتوون. جا ئەگەر ئەو (کوری باشە) نەیانفەوتێنیٚ ئەوا ڕۆژیٚ کورد سوودی خۆیان لیٚ وەرئەگرێت و ڕەنگە ئەوانیش هەر یەکەو چەند شیعرێکی لەوانەیان تیا بیٚ کە لەم دەستنوسانەدا نەبن.

٣ـ دەفتەرێکی دەست نوسی لای مامۆستا ئەهوەن ـ ئە ـ کە ژمارەیەکی باش شیعری (مەولەوی، صەیدی، شەهاب، میرزا شەفیع، ئەحمەد بەگی کۆماسی) تیایە لەگەڵ (٥٦) پارچە شیعری بێسارانی کە جێگەیان لەم دیوانەدا دیارە چەند سوودمان لیٚ وەرگرتووە.

ئەم دەفتەرە بە خەتێکی جوان و ڕێک و پێک نوسراوەو نوسەرەکەشی بەم شێوە لە کۆتایی دەفتەرەکەدا ناوی خۆی بردووە.

(حسب الفرمایش قبله و سرور خودم آغا فتاح قلم گردید اناالاقل جلال الدین ١٣٠٤)

واتە: لە سەر فەرمانی قیبلەو سەروەری خۆم ئاغا فەتاح نوسراوەتەوە، منی کەمترین جەلالەدین. ١٣٠٤.

مامۆستا ئەهوەنیش دەستاو دەست گیری کەوتوەو لای خۆی پاراستویە. شیعرەکانی ئەم دەفتەرە تێکەڵن تەنها دوو بەشی دواوەی نەبیٚ کە لە سەر بەشی یەکەمیان نوسیوویە (کلام ملا مصطفی) و لە سەر دووەمیشیان نوسیوویە (معدومی علیه الرحمة) وە لە نێوان ئەم دوو بەشەشدا قەصیدەیەکی خواڵێخۆشبو (فخرالعلما)ی بڵاوکردوەتەوە کە بریتیە لە (٤٨) بەیت.

ئیتر سەرەتای دەفتەرەکە ـ کە دیارە لێیشی پەڕیوە ـ تا ئەگاتە بێسارانی هەمووی

تێکەڵە و تەنها ئەو شیعرانەی تیا ئەناسرێن کە شاعیران نازناوی خۆیانیان تیا بردووە. جگە لە شیعری ـ گڵکۆی تازەی لەیل - کە لە سەری نوسیوویە ( فرمودۀ احمد بگ ).

لە ناو بەشە تێکەڵەکەشدا هەندێ شیعری بێسارانی تیایە کە لە نوسخەکانیتری بەر دەستماندا هەبوون و لە جێگەی خۆیاند سوودمان لێ وەرگرتوون.

۴ ـ دەفتەرێکی دەست نوسی لای میرزا محەممەدی صابیری ( میم ) کە ( ۳۵ ) شیعری بێسارانی تیایە لەگەڵ ژمارەیەک لە شیعری شاعیرانیتری وەکو ( مەولەوی ، مەهجوری ، یوسف یاسکە ، میرزا شەفیع ، ئەحمەد بەگی کۆماسی، مەحزونی ، خانای قوبادی ).

ئەم دەفتەرە مێژووی بە سەرەوە نیە ، بەڵام کۆنەو بە لای کەمەوە سەد ساڵی تێپەڕاندوە . کاک محەممەدی شیعر دۆست لەگەڵ چەند دەفتەرێکیتردا دڵسۆزانە پاراستوونی و ئێستەش خەریکە وردە وردە بە خەتە جوانەکەی خۆی سەر لە نوێ ئەیان نوسێتەوە.

ئەم دەفتەرە دیارە بە چەند دەستێک نوسراوەتەوە ، لە بەختی مندا بەشی بێسارانییەکەی بەر خەت ناخۆشێک کەوتووەو زەحمەتی زۆری دام تاکو سەرم لێ دەرکرد. جگە لەوەی خەتەکەی ناخۆشە لە هەندێ شوێنیشیدا مەرەکەبەکەی تەڕایی کەوتۆتە سەر، یا گۆشەوکەنارەکانی بۆتە خواردنی مشک و مۆریانە . بۆیە وشەی تیابوو هەروا بە بۆشی هێشتمەوەو خاڵم لە جێگەیدا داناوە ( ....... )

۵ ـ دەفتەرێکی دەست نوسی ئاغای عبدالغفاری وارستگان : ئەم دەفتەرە ( ۸ ) شیعری بێسارانی تێدایە و ئێمەیش لە جێگەی خۆیدا ئاماژەمان بۆ کردووە . دەفتەرەکە گەلێ شیعری نایابی شاعیرانیتری کوردی تێدایە وەکو ( میرزاشەفیع کولیایی ، مەولەوی ، صەیدی ، بزرگ ، خانای قوبادی ، مەحروم ، هیجرانی ، عبدالله ).

۶ - دەفتەرێکی لای مامۆستاسەییدباقری هاشمی ( سبا ) کە لە ساڵی ۱۲۷۲ ی قمری دەست کراوە بەنوسینەوەی ، ژمارەیەکی زۆر شیعری شاعیرانی تێدایە وەکو (مەولەوی ، میرزا عەبدالقادر پاوەیی ، میرزا شەفیعی کولیایی ، خانای قوبادی ) بەشی

زۆری دەفتەرەکە شیعری بێسارانی‌یەکە (١٤٠) پارچە شیعرە و پێنج غەزەلی تێدا بوو لە نوسخەکانی بەردەستماندا نەبوون. هەر وەکو لە شوێنی خۆیدا ئاماژەمان بۆکردون.

٧- بەرگی یەکەمی دیوانی بێسارانی کە بریتیە لە (١١٢) پارچە شیعر و لە لایەن کاک (کیومرث نیک رفتار)ەوە لە ساڵی (١٣٦١) بەرامبەر بە ساڵی (١٩٨٢) چاپ کراوە.

ئەم نیوە دیوانە سەرباری هەندێ هەڵە وکەم وکوڕی ئەشێ بڵێین کە کارێکی پڕ بایەخەو کاک کەیومەرث زەحمەتێکی چاکی لەگەڵدا کێشاوە، وە هەروەکو لە جێگەی خۆیدا وتومانە خۆزگە بەرگی دووەمیشی چاپکردایە، یا باشتر وابوو نەیکردایە بە دوو بەرگ و هەردوکیانی پێکەوە بە چاپ بگەیاندایە کە بەوەش هەم کارەکەی سەرکەوتوو ئەبوو، هەم ئەرکەکەشی لە سەر شانی خەڵکی‌تر کەم ئەکردەوە.

نوسەر لە پێشەکیەکەیدا بەڵگەی جوانی هێناوەتەوە بۆ ناساندنی بێسارانی و ڕوون کردنەوەی ناوی باوکی. وە سەرنجی ئێمەیشی بە لای بەڵگەکانی‌دا کێش کرد، بۆیە منیش هەر ئەوە ئەنوسم کە ئەو ڕوونی کردۆتەوە.

٨- بەرگی یەکەم و دووەمی کەشکۆڵی کەلەپوری ئەدەبی کوردی، ئامادەکردنی کاک محەممەد عەلی قەرەداغی.

٩- جگە لەو سەرچاوانەی کە باسکران، بۆ ڕاست کردنەوەی هەندێ وشەو زاراوەش سوودم لەم سەرچاوانە وەرگرتوە:

١- فەرهەنگی عمید.

٢- فەرهەنگی معین.

٣- ئەو فەرهەنگەی کە کاک محەممەدی مەلاکەریم بۆ کتێبی خوسرەوو شیرینی خانای قوبادی داناوە.

٤- کاک حەمە شەریفی بێسارانی وکاک مەحمود مەحمودی مەریوانی زۆر سوپاسیان دەکەم.

## پیتی ـ ئەلف ـ

-١-

١ـئاخ پەی مناڵی ی ......
ئاخ وا درێغا پەرێ مناڵی ی

٢ـگۆشەی خاترم جە خەم بی خاڵی ی
لاقەید بیم جەتان، جەوەشی و تاڵی ی

٣ـهەر بازیم مەکەرد من چەنی یاران
مەشیم وە باوەش نازک نازاران

٤ـنازاران جەمین لێم نمەپۆشان
مەکەردم سەیران زوڵفی وەش بۆشان

٥ـئیسە جەشومی زەمانەی باتڵ
نازاران یەک یەک لێم مەکەران سڵ

---

پەی، پەرێ = بۆ. خاترم = دڵم، بیرم. لاقەید = ئازاد. بازی = یاری. مەشیم = ئەچووم.
جەمین = تەوێڵ، ڕوو. مەکەردم = ئەمکرد. مەکەران = ئەکەن.

- ٢ -

١ - ئارۆ دیم بە چەم ، نازک ئەندامێ
ساوای تەن تەڕاو ، تۆڵە نەمامێ

٢ - عەرعەر باڵایێ ، شای جەمین جامێ
زوڵفان چوون کەمەند خەیاتەی خامێ

٣ - گرتە بێش وە دەس تۆڵێ جە عەرعەر
ساوای نازک تەن ، سافی ناز پەروەر

٤ - گاە بە دیدەی ناز مەدیا پێشەدا
گا مەگێرت وەبەژن ، باڵای وێشەدا

٥ - هەر وەخت پەیش مەدیا وەنازی چەمان
چەفت مەبی جە تاو موژەش ، چوون کەمان

٦ - ئەوسا مەگێرتش ڕاست چەنی باڵا
مەلەرزاو مەکەفت نەپاش مەلالا

---

- ١ -

**واتە :** ئاخ وەبە داخەوە بۆ منالی ی. گۆشەی دڵم لە خەم و پەژارە خاڵی بوو. ئازاد بووم لە هەموو تانەو خۆشی و تاڵیەک . لە گەڵ هاوڕێکانمدا یاریم ئەکردو ئەچوومە باوەشی ناسک نازدارانەوە. نازدارەکان ڕوویان لێ نەئەشاردمەوەو منیش سەیری زوڵفی بۆن خۆشیانم ئەکرد. بەڵام ئێستە لە دەستی شوومی ڕۆژگاری هیچ و پوچ ، یەکە یەکە نازدارەکان سڵم لێ ئەکەن.

٧ـ یانی جه هەرکۆ نەمامێ باخ بۆ
یا ئەو وەباڵای وێش بە دەماخ بۆ

٨ـ هەنی وەباڵای وێشان نەنازان
ئاوات وەسایەی باڵاش بوازان

- ٣ -

١ـ ئارۆ خەمانم چوون دەماوەند بی
دیدەی قیبلەی وێم بەندی شەوبەند بی [أ]

٢ـ واتم ئەی [ب] قیبلەم ، ئیمان ودینم
من بە [ج] دیدەی تۆ دنیا مەوینم

---

- ٢ -

گرتەبێش =گرتبوی . مەدیاپێشەدا = پیایدا ئەروانی . گامەگێرت = جارجارێ ئەیگرت. چەمان = چاوان . مەلەرزا و مەکەفت = ئەلەرزی و ئەکەوت . بوازان =بخوازن.

**واتە** : ئەمڕۆ چاوم بە ناسک ئەندامێ کەوت ، کە تولەنەمامێکی کۆرپەی ئاودار بوو . باڵای وەک داری عەرعەر ، دەم وچاوی وەک ئاوێنە ، هەردوو زوڵفیشی وەکو کەمەند درێژ کە لە خەیاتەی خاو بێ . تولێ لە عەرعەری گرتبوو بە دەستەوە ،کە ساوایەکی لەش ناسکی بە ناز پەروەر بوو . جارجار بە چاوی نازەوە سەیری ئەکردو جارجارێکیش ئەیگرت بەقەد و بەژن وباڵای . هەرکاتێ بە نازی چاوەکانی تێی ئەڕوانی لە تاو برژانگی وەکو کەمانی لار ئەبوویەوە . ئەوکاتەی ئەی پێوا بە باڵای خۆی ئەلەرزی و ئەکەوت و لە بەرپێیدا ئەلالایەوە . واتە لە هەر شوێنێ نەمامی باخ هەبوو کە خۆشی‌ی لە باڵای خۆی ئەهات . بڵێن با ئیتر بە باڵای خۆیدا نەنازێ و ئاوات بە سێبەری باڵای ئەو بخوازێ .

٣ـ مەر(د)نەئیشەڵا ئێشیٚ هاتێشدا
پەوکەی شەوبەندت ئاورەردەن پێشدا

٤ـواتش(ە)بیٚ ڕامەن، وەشەڕ شەریکەن
هونینی، دەردین، ڕاویار پەیکەن

٥ـئەر مەرەخەس بۆ چوون هەردە جاران
دەییار نمازۆ جە ڕاویاران

٦ـمنیچ جەو بۆنە مەحبوسم کەردەن
هوونی ناحەقم نەیۆ وەگەردەن(و)

٧ـ سازانام تاقی(ز)حەقش بە دەستەن
ڕاویار کۆشەن، ئەنقەسش بەستەن *

---

دەماوەند = چیایەکی بەرزە لە باکوری خۆرهەڵاتی شاری تاران کە بەرزییەکەی ٥٦٧١ میتر ئەبیٚ و لە زنجیرە چیای ئەلبورزە. ڕام= ڕەحم .سۆز. ڕاویار = ڕێبوار. نمازۆ = ناهێڵیٚ. مەحبوس = بەند. هوون = خوێن.

**واتە :** ئەمڕۆ خەمەکانم لە چیای دەماوەند ئەچوو، چونکە چاوی یارەکەم بە چارشێو گیرابوو. ووتم:خۆشەویستەکەم، ئاین ودین وبڕوام، من بەو چاوانەی تۆ دنیا ئەبینم. مەگەر خوانەخواسە هاتوەتە ئێش وا چارشێوت داوە بەڕوویدا. ووتی نەخێر، لە بەر ئەوە دامپۆشیوە، چونکە بیٚ بەزەیی و شەڕخوازە، خوێن ڕێژو دەرداویەو دڵی ڕێبواران ئەپێکیٚ. ئەگەر وەکو جاران بەرەڵا بیٚ، ئەوا یەک کەس لە ڕێبواران ناهێڵیٚ. منیش بەو بۆنەوە بەندم کردووە، نەوا خوێنی خەڵکم بێنێتە گەردن. ئینجا بە ڕاستی بۆم دەرکەوت کە هەقیەتی وای لیٚ کردووە،

- ٤ -

١ ـ ئارۆ خەزانیْ دوور جە پای نەمام
ضایف و زەبوون هیجران سەر ئەنجام

٢ ـ ئەویچ بە جەستەم[أ] مەناڵا بە زار
بە جەفای هیجران مەکەردش ئیقرار

٣ ـ پەرسام هەی زەدەی گەردونی بیْ ڕام
زیندەی سەرشووم،[ب] دوور جە پای نەمام

٤ ـ چ بەدبەختیتەن پێسە پێت ئامان ؟
مەرنەخاوت دی دووریی نەمامان ؟[ج]

---

- ٣ -

چونکە ڕێبوار کوژە و کوشتنی کردوە بە پیشە .

(أ) لای (ک) نوسراوە : دیدەی قیبلەم دیم ، بەندی شەو بەندینم بی .

(ب) لای (ک) نوسراوە : هەی .

(ج) لای (ک) نوسراوە : من بەو .

(د) لای (ک) نوسراوە : مەگەر .

(ە) لای (ک) نوسراوە : وات .

(و) لای (ک) نوسراوە : هوونانی ناحەق نەیۆم وەگەردەن .

(ز) لای (ک نوسراوە : ئاخر .

(※) ئەم شیعرە لە دەست نوسەکەی لای (ئە)دا بووە بە هەشت بەیت وئەڵیْ :

ئەی کەلام جە لەفظ قیبلەم شنەفتم    تەسەللای قیبلەم ، ئەوسا نـەرەفتم .

**٥ـ واتش هەی بێ دەرد دەرون پڕ جەخار**
**سەرگەشتەی هیجران، زەدەی[د] ڕۆزگار**

**٦ـ یە هیجران کەردەن، جەدیدە کۆربام**
**نەتەرز مەوینون، نە باڵای نەمام**

---

**ضایف = زەعیف، لاواز. زەبوون = داماو. هیجران = دووری. مەناڵا = ئـەیناڵاند.**
**زار = کزۆڵ. پەرسام = پرسیم. بێ ڕام = بێ ڕەحم، بێ بەزەیی. پێسە = ئاوا. خاو = خەو.**
**واتش = ووتی. سەرگەشتە = ئاوارە. کۆر = کوێر. مەوینون = ئەبینم.**

**واتە:** ئەمڕۆ گەڵایەکی وەریوم دوور لە دارەکەی بینی، لاواز و داماو کە دوورکەوتنەوە ببوە سەر ئەنجامی. ئەویش بە کزۆڵیەکەوە بۆڵەشی من ئەگریاو ڕازی دوورکەوتنەوەی خۆی دەرئەبری. پرسیم ئەی داماوی دەستی گەردونی بێ بەزەیی، ئەی زیندوی سەر سەختی دابڕاو لە دارەکەت، بەوبەختیت چی‌یە وا بەم جۆرەت لێ هاتووە؟ مەگەر خەوت بینی و خەوت لێ کەوت والە نەمامەکەت دووری‌ی.؟ ووتی ئەی بێ عاری دڵ پڕ لە دەرکی سەرگەردانی وگیرۆدەی تاوانی ڕۆژگار. کوێر بم دوورکەوتنەوە دووچاری ئەم دەردەی کردم کە نە تەرزەکەم ئەبینم نە دارەکەم.

**(أ) لای (ک) نوسراوە: پەی جەستەش.**
**(ب) لای (ک) نوسراوە: بەختی شووم.**
**(ج) لای (ک) نوسراوە: ناماماں.**
**(د) لای (ک) نوسراوە: جەفای.**

**١ـ ئارۆ خەزانیٚ زەردبامم وینا**
**کەفتەبیٚ نەگۆل، تافی لاڵ مینا**

**٢ـ عەکسش دیار بی، نەگۆلی ئەوتاف**
**چمان من مدیام نەرووی جامی صاف**

**٣ـ شیام هۆرم گرت دییام پیٚشدا[١]**
**چمان چەمم دان وەسەری نیٚشدا**

---

زەردبام = وەکو زەرد . وینا = بینی ،دیم . کەفتەبی = کەوتبوو . لاڵ = لەعل، بەردیٚکی بەنرخە . مینا = بیٚ گەرد ، شوشە . تاف = تاڤگە . چمان = ئەت ووت . چمان = وەکو ئەمە . مدیام = تەماشام ئەکرد . شیام = چووم . هۆرم گرت = هەڵم گرت . چەمم = چاوم . نیٚش = نوکی تیژ .

**واتە** : ئەمرۆ گەڵایەکی زەردباوم بینی کە کەوتبوە ناو گۆلیٚ ئاوەوە ، وینەکەی لە ناو گۆلەکەدا جوان دیار بوو، ئەت ووت لە ناو ئاوێنەیەکی شوشەی بیٚ گەردا ئەیبینی . چووم هەڵم گرت و سەیرم کرد ، هەر وەکو چاوم لە سەر نوکیٚکی تیژ بگیرسیٚتەوە وابوو .

**تیٚبینی** : ئەم بەیتی سیٚیەمە بەو شیٚوەی کاک کەیومەرس هیٚناویەتی لە جیٚگەی خۆیدا نیە، وە لە پەراویٚزیشدا نووسیویە [ ئەم شیعرە لە نوسخەیەکدا بەم چەشنە هاتبوو :

**شیام هۆرم گرت . دیام پیٚشەدا چمان چەم دان بە سەر ویٚشەدا[١]**

وەکو خۆی ووتویە ئەمەش هەر ڕاست نیە .کە واتە هەر بەم شیٚوەیە کە لە دەست

- ٦ -

١ ـ ئارۆ ڕاگەم کەفت شیم وە چەمەن دا
دیم بولبولّ نە صەحن باخی گولّشەن دا

٢ ـ مەدۆ وەسەردا پەی ئەندوهی دلّ
ماچۆ کوون ڕەونەق بازاڕی بولّبولّ .؟

٣ ـ جە جەستەی پەشێو ، ئەو پەشێو جەستە
منیچ جە هیجران تەمام بیم خەستە

٤ ـ دەردی دووریی ، وەنەم دێوییان
شادیم ، جەشیوەن بولّبولّ شێوییان

---

- ٥ -

خەتەکەی بەردەستی ئێمەدا هەیە . چونکە شاعیر کە ئەڵێ : چووم هەڵم گرت وسەیرم کرد، هەر وەکو چاوم لە سەر نوکێکی تیژ بگیرسێتەوە وابوو . ئەمە ڕاستە نەک ئەوەی کە (ک) وەری گرتوە و ئەڵێ : وەکو ئەوە بوو جامێ خومی بە سەر خۆیا ڕژاندوە.[٢]

لێرەدا هەڵەکە لەوەدایە شاعیر باسی گەڵایەکی زەرد باوی وەریو ئەکات ، ئیتر لەگەڵ ئەم ڕەنگە زەدەدا هێنانی ووشەی (خوم) هەڵە دەرئەچێ . چونکە ڕەنگی (خوم) شینێکی تێرە .

(١) بڕوانە لاپەڕە (٣٨)ی دیوانی بێسارانی ئامادەکردنی (ک).

(٢) بڕوانە لاپەڕە (٣٨)ی دیوانی بێسارانی ئامادەکردنی (ک).

(أ) لای (ک) نوسراوە : **شیام هۆرگرتم دیانی پێش دا**
**چمان کاسەی خوم ڕێزان بەوێشدا**

## ٥ ـ ئەسرینان سەردان جە دەروونەوە
## موژەم دان بە دام دەریای هوونەوە *

---

**راگەم = ڕێم . کەفت = کەوت . شیم = چووم . صەحن = حەوشە . مەدۆ = ئەدا . ئەندوە = خەم و خەفەت . ماچۆکوون = ئەڵێ کوا ؟. وەنەم = لێم . دێوییان = تێکچوو . دام = داو . هوون = خوێن .**

**واتە** : ئەمڕۆ ڕۆشتم و ڕێم کەوتە چیمەنێ ، سەیرم کرد بولبول لە ناو حەوشەی باخی گوڵزارەکەدا .. لە بەر پەژارەو داخی دڵ ئەدا بە سەریاو ئەڵێ : ڕەونەقی بازاڕی بولبول چی بە سەر هات و کوانێ ؟ . لە بەر ناڵەو هاواری ئەو کە لاشەی پەشێو کردبوو ، منیش کەوتمە بیری خۆم و لە بەر دووریم لە یارەوە تەواو نارەحەت و ماندوو بووم . لە ناو دەردو ئازاری دووری خۆیشم لە گەڵ ناڵەو هاواری بولبولەکەدا لێ تێکچوو . فرمێسکەکان لە ناخی دەروونەوە هاتنە دەرو برژانگم دا بەدەم داوی دەریای خوێنەوە .

لەم شیعرەدا وا دەرئەکەوێ کە لە ڕۆژێکی پاییزی درەنگدا ، کاتێ کە گوڵەکان کۆچ ئەکەن ، بێسارانی چریکەی بولبولێک بە گریان تێگەشتووە و ئەمیش لەو دەنگەوە کەوتۆتە بیری ئەو هاوڕێ وکەسانەی کە پاییزی مەرگ کۆچی هەتاهەتایی پێ کردوون .

خۆزگە بێسارانی لەم شیعرەدا چەند داخێکی تری هەڵگێشایە ، واتە چەند بەیتێکی تری پێشکەش کردینایەو لەو بەتیانەدا ناوی هەندێ لە هاوڕێکانی ببردایە ، کە ئەوەش بۆ لێکۆڵینەوەی مێژوویی زۆر چاک ئەبوو ، هەر وەکو مەولەوی تاوگۆزی کردوویە.

**(*) ئەم شیعرە لە دەست نوسەکەی لای (میم) وەرگیراوە .**

١ ـ ئارۆشیام دیم ڕەنگی خەزانان
حاڵێ شان نیەن ، ئێمە نەزانان

٢ ـ دیم بە تەرزەوە خەزانێ بەی تەرز
تەمام حاڵی وێش پەرێم کەردش عەرز

٣ ـ پەرسام یە چێشەن ئی زەردی خەزان ؟
وات مەیۆم نەخاو جیایی[أ] تەرزان

٤ ـ واتم من[ب] وتۆ هەردوو جەستەمان
ئێش مەکەران زام ماران گەستەمان

٥ ـ تۆ جیا جە تەرز ، من جە باڵایێ
تەڕ تەر جە نەرگس ، سەوڵی ئاڵایێ

٦ ـ داخی جیایی نەوتوڵ نەمامان
تۆ نە[ج] خاوت دی ، من پەنەم ئامان

---

شیام = چووم ، ڕۆشتم . تەرز = لق ، چڵ . بەی تەرز = بەم جۆرە . پەرسام = پرسیم . یەچێشەن = ئەمە چی‌یە . مەیۆم نەخاو = هاتوەتە خەوم . سەوڵ = گیایەکی گەڵا پانی سەوزە گوڵێکی پانی سوور ئەگرێ .

**واتە** : ئەمڕۆ چووم سەیری ئەو گەڵا وەریوەم کرد لە سەر خۆی نیەو ئێمەیش نەمان زانیوە . بە چڵە کەیەو گەڵایەکی بەم جۆرەم بینی کە هەموو بە سەرهاتی خۆی

- ٨ -

١ ـ ئارۆ وێنەی وێم ، دیم خەزانیٚ زار
بەند بی بەزامەت ، جەورو جەفای خار

٢ ـ ئەو جە دەردی وێش بیٚ مدارابی
خار چەنگی زامەت لێش ویارابی

٣ ـ بە زارزارەوە هەروێش مەشانا
جەزامەتی خار دووریش مەنمانا

٤ ـ خار شەرمش نەکەرد جە ڕەنگی زەردش
تا بە جەفاو جەور سەد پارە کەردش

---

- ٧ -

بۆ گێڕامەوە.پرسیارم لیٚ کرد کە بۆزەردو هەڵوەریوی.؟ ووتی : هۆی ئەوەیە کە لە خەودا بینیم لە چڵەکانیان جیا کردینەوە. ووتم من و تۆهەردوو لاشەمان ئێش ئەکا، زامداری ماران گەستەین. تۆ لە چڵەکان جیا بویتەوە ،من لە باڵایەکی لە نێرگز تەڕتر کەلە سەوڵی ئاڵا ئەچوو. داخ وناسۆری جیابوونەوە ئەی تازە توڵی نەمام، تۆ بەخەودیوتە ، بەڵام من بە سەرم هاتووە.

(أ) لای (ک) نوسراوە : تەناکی.

(ب) لای (ک) نوسراوە : ئێمە.

(ج) لای (ک) نوسراوە : تۆ جە خاوت.

**٥ـ فەرضەن[أ] جە هەر کۆ دەردەداریٚ بۆ**
**زەدەی زامی سەخت نیٚشی خاریٚ بۆ**

**٦ـ ئەویچ چوون جەستەی من دەردەدار بۆ**
**یا بەی تەور زەدەی زامەتی خار بۆ**

-٩-

**١ـ ئافتاو پیٚوار بی .........**
**وەختیٚ جە مەغریب ، ئافتاو پیٚوار بی**

**٢ـ جەمینش جە بورج تەشاو دیار بی**
**پەیوەست گەرمی وەخت سەباو ئیٚواربی**

---

-٨-

**خار = درِک . بیٚ مدارا = بیٚ تاقەت . لیٚش و یارابیٚ = لیٚی هەلّپیٚکابو . مەشانا = ڕائەتەکاند . دووریش مەنمانا = دووریی ئەنواند .**

**واتە :** ئەمرِۆ گەلاّیەکی لاوازی وەک خۆمم بینی کە گیرۆدەی زەحمەت و زۆرو ستەمی درِکیٚ بووبوو .ئەو لە تاو دەردی خۆی زۆر بیٚ تاقەت و بیٚ ئارام بوو ، درِکیزەحمەت خۆی لیٚ هەلّپیٚکابوو . بە دەنگیٚکی زویرەوە هەر هاواری ئەکردوخۆی ڕائەوەشان،تاکو لەو زەحمەتە خۆی دوور بخاتەوە . درِکەکە بیٚ ئەوەی شەرم لە ڕەنگی زەردی بکا ، بە زۆر و ستەم کردم بە سەد لەتەوە . وا دانییٚن کە لە هەر شویٚنیٚ دەردەداریٚ هەبیٚ ، دەردەکەیشی پیٚکرانی زامی سەختی نوکی درِکیٚ بیٚ . ئەویش وەکو لەشی من دەردەدار بیٚ ، یا بەو جۆرە پیٚکراوی زەحمەتی درِک بیٚ .

(أ) لای (ک) نوسراوە : ڕاستەن .

**٣ـ بە نوری جەمین شەوق ئارای تەمام**
**یاوناش وەهەم وەختی صوبح وشام**

**٤ـ پرشنگی نورش پەی پەی مەشانا**
**من دەرسات وەڕووش (لافتی)م وانا[ب]**

**٥ـ سپەردم بە نوور بارگەی ئیماما ن**
**چەندیٚ نوور بەخش بۆ پەی صوبح وشامان[ج]**

---

پێوار = ون ، ناڎیار. بورجی تەشاو = ناوە بۆ شوێنیٚ کە خۆری لێوە ئاوا ئەبیٚ ، زاراوەیەکی ئەستێرە ناسیە . پەیوەست = پێکەوە لکاو . یاوناش = گەیاندی. نیک = ووشەیەکی فارسی‌یە واتە چاک . مشانا = ئەیوەشاند . دەرسات = خێرا . لافتی = ووشەیەکی عەرەبیە

**واتە :** ( هیچ لاویٚ نیە ) . ئیشارەتە بەو ڕستەیەی کە بۆ حەزرەتی عەلی کوڕی ئەبوطالیب وتراوە ( لافتی‌الا علي - لاسیف الاذولفقار ) .

**واتە :** هیچ لاویٚ نیەعەلی نەبێت ـشمشێریش نیە ( زولْفەقار نەبیٚ ) زولْفەقاریش ناوی شمشێرە دوو دەمەکەی حەزرەتی عەلی‌یە .

**واتە :** هەتاو نادیار و ون بوو ، لەکاتی خۆرنشین دا هەتاو نادیار بوو . ناوچاوی لە بورجی تەشاوەوە دەرکەوت ،کاتی بە یەک گەشتنی بەیانی و ئێوارەی نیشان دا . بە ڕووناکی ناوچاوی تیشک بەخشی کاتی ئێوارە و بەیانی‌ی بە یەک گەیاند . سپاردم بە ڕوناکی‌ی بارگەی ئیمامەکان ، تا ماوەیە ڕوناکی ببەخشیٚ بە بەیانی و ئێواران . پرشنگی ڕوناکیەکەی یەک لە دوای یەک بڵاو ئەکردەوە ، منیش خێرا لە ڕوویدا (لافتی)م خوێندەوە .

لەوە ئەچیٚ شاعیر ئەم شیعرەی بۆ مەرگی پیاوێکی ئاینی ووتبیٚ . ڕەنگە ناوی

- ١٠ -

**١ ـ ئاماو شیانی ..........**
**چەند ڕا، وەبیٚ ڕا، ئاماو شیانی**

**٢ ـ تا کەفتا نەدام   ناواک نیانی**
**نیانش بەردان   بە یەک دیانی**

---

- ٩ -

(عەلی) بووبیٚ بەو پیٚیەی کە ووشەی (لافتی)ی هێناوە ، بەو پیٚیە سەمبولەکانی تری ناو شیعرەکە وایان لیٚ دیٚ.

**ئافتاو = کەسەکەیە. مەغریب = کاتی مردن. جەمین = ڕۆح ، گیان. بورجی تەشاو = گۆڕ.** کە واتە مانای دووەمی شیعرەکە بەم شێوە لێک ئەدرێتەوە.

( عەلی .. کاتیٚ کە مەرگ یەخەت ئەگریٚ و ون ئەبی .گیانت ئەکەوێتە گۆڕەوە و بەوەش بەیانی و ئێوارە پێکەوە ئەبەستێت ، مەبەست لە بەیانی کەسەکەیەو ئێوارەش تاریکایی ناو گۆڕەکە . لە بەشی یەکەمی بەیتی چوارەمدا دەرئەکەویٚ کە ئەو کەسە پیاوێکی پایەبەرزی ئایینی بووە ، چونکە شاعیر ئەیسپێریٚ بە نوری بارگەی ئیمامەکانٚ ، کە ئیمامەکانیش حەزرەتی عەلی سەر قافڵەچییانەو لەووەوە ئەڵقەی یەکەمی زنجیرەکە دەست پیٚ ئەکات . )

لێکدانەوەکەی کاک کەیومەرس لە جێگەی خۆیدا نیە کە لە پەراوێزی لاپەڕە (٢٨)دا باسی کردوە . چونکە (لافتی) ئیشارەت نیە بە هیچ سورەتێکی قورئان ، بەڵکو وتەیەکە لە پیاهەڵدانی حەزرەتی عەلیدا وتراوە. ئەمەش هەروەها پەیوەندی بە چاوەزارەوە نیە ، واتە نزایەک یا دوعایەک کە شتیٚ لە چاوی پیس بپارێزیٚ. ئەوەی کە لە قورئاندا لەم بارەوە وتراوە [ وان یکاد الذین کفروالیزلقونک بابصارهم لماسمعوالذکرویقولون انەلمجنون وماهوالاذکرللعالمین.]

**(أ) و (ب) لای (ک) پاش و پێش نوسراون.**

**٣ـ سەوگەندم وەردەن، سینە چاک چاکان**
**فرەم ئاوەردەن زامی ناواکان**

**٤ـ بەی تەور جە نیگای نەبان کێشانم**
**هیچ ناواک نەدان، جەفا، ئێشانم** *

- ١١ -

**١ـ ئاهوی خوتەن خێز، دیدە تیر خەتا**
**تاتاری ڕەوێڵ، نافە موشک مەتا**

**٢ـ وەقت نیمەشەو، خاو مەیۆ نەزد ئەو**
**تمەز دیدەی وێش مەوینۆ نە خەو**

---

- ١٠ -

**ئاما = هات. شیانی = تێ پەڕی. وەبێ ڕا = بێ ڕێگە. ناواک = تیر. نیانی = نهێنی. دیانی = دین = بینین. سەوگەند = سوێند. وەردەن = خواردوە. فرەم = زۆرم. ئاوەردەن = هێناوە. بەی تەور = بەم جۆرە. نەبان = لەبن.**

**واتە :** هات و تێپەڕی، چەند جار بە بێ ڕێ وشوێن هات و تێپەڕی. تا کەوتە داوی تیری نهێنیەوە، ئەو نهێنیەشی بە دیدەنیەک ڕەواندەوەوبردی. سوێندم خواردووە بە سینەی لەت لەتم کە زامی تیرەکانم زۆر خواردووە. بەم جۆرە لە نیگاو ڕوانینی‌دا لە بن وبنچینە دەرهاتم و ئەوەندە زوو گیانی لێ سەندم، کە بە تیرەکەی هیچ ئێش و ئازارێکم پێ نە گەشت.

**(*) ئەم شیعرە لە دەست نوسەکەی (میم)مان وەرگرت، هەروا چۆن نوسرابوو هەروەکو خۆی نوسیمانەوەو بەو شێوەش مانامان لێک دایەوە، هیوادارم بە هەڵەدا نەچووبم.**

٣ـ جه سامی موژەی ویٚش بیٚدار مەبۆ
دەرسات بیٚ پەروا جەڕەم تار مەبۆ

٤ـ بەڵیٚ چیٚش مەبۆ، ڕەوان، خاتر شاد
جەوەشی دەوران، صافی سەرئازاد

٥ـ ئەحیاوان پڕ گوڵ، ناڵەی بولبولان
دایەرەی زنجیر زوڵف سونبلان

٦ـ مەبۆ بە پابەند ئەی خوتەن خیٚزە
ئەی ئاهوی ڕەویٚڵ، موشک ناف بیٚزە

٧ـ بۆی خوتەن مەیۆ، ئاهوی تافەوە
تاف پیٚچان بەبۆی موشک نافەوە

٨ـ ئیسە کەردەنش بەزیٚد، هەم ماوا
ئاوا بۆ شەڵڵا، پیٚش نیەن ئاوا؟

٩ـ یاشا بەشقی ویٚت، خاتر ئازادان
نەڕیٚشان نەدام ناشی صەیادان *

---

خوتەن خیٚز = لە ناوچەی خوتەن پەیدا بوو. خەتا = شارێکە لە چین.
تاتار = ناوچەیەکەو جێگەی ژیانی تورکە مەغولەکان بووە. مەیۆ = دیٚت.
نەزد = نزیک، لای. مەوینۆ = ئەبینیٚ. ڕەم = ڕان، ڕەوە. ئەحیاوان = بژوێنەکان.
ڕەویٚڵ = کۆمەڵ. خوتەن = ناوچەیەکە لە تورکستانی سەروو. زیٚد = شوێنی لە دایک

**بوون . ماوا = شوێن،جێگە . بەشقی = بە عەشقی . وێت = خۆت . نەرێشـان = ئـازاری نـەدەی . ناشـی = نـەزان ، تازە کار. صەیاد = ڕاوچی .**

**واتە :** ئەو ئاسکەی کە لە (خوتەن) پەیدا بووە و چاوی وەکو تیری ئاسکەکانی شاری (خەتا) وایە ، شاجوانی ناو ئەو ڕەوە ئاسکانەیە کە موشکی ناوکیان کاڵاو سەرمایەی ژیانە. لە کاتی نیوەشەودا کە خەوی لێ ئەکەوێت ، چاوی خۆی لە خەودا ئەبینێ . لە ترسی برژانگی خۆی خەبەری ئەبێتەوەو لە خەو ڕائەپەڕێ ، هەر ئەوکاتە ئیتر هەڵدێ و لە ڕەوەکەی جیا ئەبێتەوە . بەڵێ چی ئەبێ ؟ بە دڵێکی شادەوە تیێ ئەتەقێنێ و ئەڕوا ، لە خۆشی ڕۆژگار و زەمانە بە دڵێکی بێگەردو سەربەرزی‌یەوە دەست ئەکات بەگەڕان . شوێنە تەڕو بژوێنەکان پڕپڕن لە گوڵ و ناڵەو چریکەی بولبول ، هەر ئەو شوێنانە بوونەتە بازنەیەک کە وەک بە زنجیری زوڵفی سونبول کێشرابێ . ئەبێتە پابەندی ئەو ئاسکی خوتەنە، ئەو ئاسکی ناو ڕەوە ئاسکەی کە ناوکیان موشک ئەبێزرێنێ . بۆن و بەرامەی (خوتەن) دێت و ئـاسکی بـەر تاڤگەکەشی بۆنی موشک و تاڤگەکە تێکەڵ بە یەک ئەکات ـ ئێستە لای ئەو تاڤگەیەی کردووە بە زێدو نیشتمان و ئیشەڵائاوەدان ئەبێ، ئەی گوایە پیێ ئاوەدان نەبووە ؟ خوایە بە خۆشەویستی خۆت و هەموو ئەوانەی کە بە دڵ ئازادی‌یان ئەوێت ، نەیخەیتە تەڵەو داوی ڕاوچی‌یەکی نەزانەوە.

لەم شیعرەدا بێسارانی ئافرەتێکی هێندە جوان و شۆخ و شیرین و دیندارمان پێ ئەناسێنی کە لەگەڵ ئەوەشا وەها پارێزگاری ئابڕوونامووسی ئەکات تەنانەت سڵ لە برژانگی چـاوەکـانی خۆیشی ئەکات ، لەخوا ئەپارێتەوە ئەو ئافرەتە دیندارە نەکـەوێتە چـارەنوسی نـاکـەسان ، ئافرەتێکی واکەدووری گرتوەو تێکەڵ بەئافرەتانی ترنابێت . ئافرەتانی ترکە بەدەم ئیش وکارەوە دێن وئەچن وئەملاولا ئەکەن ، ئەم لیێـان جـویێ بـۆتەوەو لەبـەر تـاڤگەی بـەرماڵە کـەیاندا یاناوباخەکەیاندا ئارامی گرتوە . شاعیریش کەئەوئەناسێ ، لای خوانزائەکات کە نەکـەوێتە چارەنوسی کەسێکی نەزانەوە و ژیانی بەخەسار بچێ .

وەشاعیر لەبەرامبەر ئەو خەڵکە یائەو ڕاوچی‌یە نەزانەدا ڕەنگە خۆی بەزانـاو ڕاوچـی کـارامـە بزانیت وە لەنزاکەیدا لەخوا ئەپارێتەوە کەبکەوێتە داوی چارەنوسی خۆیەوە .

**(*) ئەم شیعرە لە دەست نوسەکەی (میم) وەرگیراوە .**

١ـ ئاهوی وەحش تار .......
جەیرانی سوب خێز ئاهوی وەحش تار

٢ـ شۆخی لارەولەنج دیدە پڕ خومار
سپەردیم وەدین ڕەسولی نازدار

٣ـ ڕۆیێ هۆرێزا عەزمی سەحرا کەرد
پەی جەلای جەمین ، دەست پەرێ جام بەرد

٤ - بە پێشی ئاوەرد دیا نەپێشدا
دەست ئاوەرد وەبان زوڵفانی وێشدا

٥ - دەست ئاوەرد وەبان زوڵفی خام دا
لێڵایش ئاوەرد وەڕوی جامدا

٦ـ ئەودیا وەجام ڕەنگ زەرد و زگار
جام دا وەسەنگدا گرەوا بە زار

٧ - واتش ئەرێ جام تۆ چە جامێنی
وێران بۆ ئەوشار تۆلێش ئامێنی

٨ـ جام ئاما زوان فراوان لاڵا
واتش تەقصیرم بێ عەیبەن وەڵڵا

٩ ـ تەقصیرم چێشەن مدەریم وەسەنگ
شۆڵەی جەمینت من گێڵان جە ڕەنگ ؟

١٠ - تەمام صەرافان جەڕوی سەرزەمین
بەیان بوینان ئاینەی جەمین

١١ ـ ئەرتۆ ئاینەت نەگێڵان جەڕەنگ
من بێجام واتەن ، سەرم دان وەسەنگ *

---

ڕۆیٚ = ڕۆژیٚ . هۆرێزا = هەڵسا . جەلا = ڕۆشنایی . جام = ئاوێنە . ئاوەرد = هێنای . خام = خاو . زگار = زویر . سەنگ = بەرد . گرەوا = گریا . ئامێنی = هاتویی . مدەریم = ئەمدەی ، ئەمکوتی . شۆڵە = شوعلە . صەراف = پارە وپوڵ گۆڕەرەوە . بەیان = بێن . بوینان = ببینن . واتەن = وتوە

**واتە** : ئاسکی کێویلەی هەڵهاتو ، ئاسکی بەیانی زوو لە خەو هەڵساو . شۆخ و شەنگی بەلەنجەولار ، چاو مەست ،سپاردمیت بە دینی پێغمبەر . ڕۆژیٚ هەڵساو نیازی دەشت وسارای کرد، بۆ ڕوون کردنەوەی یا خود بۆ بینینی ڕوخساری دەستی برد بۆ ئاوێنەیە ، هێنایە پێشەوە وسەیری کرد ، دەستی هێنا بە زوڵفیدا . دەستی هێنا بە زوڵفی خاویدا ، لێلایی هێنا بە ڕووی ئاوێنەکەدا . کە خۆی بینی لە ئاوێنەکەدا ڕەنگی زەردو هەڵبزڕکاوە ، ئاوێنەکەی دابە بەردێکدا و دەستی کرد بە گریان . ووتی : ئەی ئاوێنە تۆچ ئاوێنەیەکی ؟ وێران بیٚ ئەو شارەی کە تۆی لێوە هاتووی . ئاوێنەکە هاتە زمان و زۆر لالآیەوە ، ووتی کەم وکوڕیم نیەو بەخوا بیٚ نەنگم . تاوانم چیيە ئەم دەی بەبەردا ؟ ، من ڕەنگی تیشکی ناو چاوتم گۆڕیوە .؟. هەموو ئەوانەی کە پارەو پوڵ ئەگۆڕنەوە لە سەر زەویدا بێنی و ئاوێنەی ڕووی من ببینن ، ئەگەر تۆ ڕەنگی ئاوێنەکەت نەگۆڕیبوو ئەوا من باشم نەووت و سەرم دای لە بەرد .

* ئەم شیعرە لە دەست نوسەکەی لای (ئە) وەرگیراوە ، نە لای (ک) و نە لە دەست نوسەکەی بەر دەستیشماندا هەیە .

- ١٣ -

١ ـ ئەجەل داوم بۆ ......
تاکەی من چەنی دەوران داوم بۆ ؟

٢ ـ تاکەی شەو بیٚ یار ، شیرین خاوم بۆ ؟
بۆ با پات وەبان هەر دووچاوم بۆ

٣ ـ ئەرسەد پەژاران گیانم مەستانان
وەس نیەن بە نام زیندەم مەوانان

٤ ـ سپای غەم بەی تەور زۆر گرتەن وەنەم
هەر ساتیٚ مەرگیٚ مەنمانۆ پەنەم

٥ ـ سەندەن نیمەییٚ ، ئەویچ هیجرانان
گەرەکشان بە زۆر چەنەم بستانان

٦ ـ نەواچی پەی چێش من چیم نەزانان
ئیسە مواچو ئەجەل ها هانان (أ) ؟

٧ ـ گیانیٚ کە بەرشیی بە یەک دیانیٚ
جە کۆ باوەروون پەرێت ، گیانیٚ .؟

٨ـ شەماڵ شۆ واچە ، بەو ئایرناکە
بەو دڵ سفتەی خەم ، سینە چاک چاکە

٩ـ ئەر سەد ساڵ سوچۆ وەندار جە شاخان
چێ پەروا دارۆ عەرعەر جە باخان ؟

---

داو = داوا ، دەعوا . پات = پێت . مستانان = ئەسێنن . موانان = ئەخوێنن . زۆرگرتەن وەنەم = زۆری بۆ هێناوم . منمانۆ پەنەم = پێم ئەنوێنیٚ . مەنەن = ماوە . گەرەکشان = ئەیانەویٚ . چەنەم = لێم . بستانان = بسێنن . نەواچی = نەڵێی . بەرشی ی = دەرچوو . دیان = ڕوانین ، نیگا.باوەروون = بێنم . پەرێت = بۆتۆ. شۆ = بڕۆ . واچە = بڵێ . ئایرناک = ئاگرین . چاک چاک = شەقار شەقار . سوچۆ = بسوتیٚ . وەن دار = دارەوەن . دارۆ = هەیە .

**واتە** : ئەجەل تاکەی داواو ناکۆکیم هەبیٚ ، تاکەی لەگەڵ چەرخی دەوراندا ناکۆک بم . تاکەی شەو بە بیٚیار لە خەوی شیرین دابم ، وەرە با پێت لە سەر هەر دوو چاوم بیٚ . ئەگەرچی غەم و پەژارە سەدبار گیانم ئەسێنن ، بەڵام بەس نیە هەر بە زیندوو ناوم ئەبەن . لەشکری غەم بە جۆریٚ زۆری بۆ هێناوم ، هەر ساتێک و مەرگێکم پیٚ نیشان ئەدا . نیوە گیانێکم ماوە ئەویش دوورکەوتنەوە و لە یەک بڕان ئەیانەویٚ بە زۆر لێم بسێنن . نەڵێی بۆچی کە من نەمزانیوە ، ها .. ئیستە پێت ئەڵێم . گیانیٚ کە بە بینین و نیگایەک دەربچیٚ ، دەی تر لە کویٚ گیانێکی ترت بۆ بێنم ..؟ .

شەماڵ بڕۆ بەو ئاگرتیٚ بەربووە ، بەو دڵ سوتاوی سنگ شەقار شەقارە بڵیٚ . ئەگەر سەد ساڵ داری ( وەن ) لە شاخاندا بسوتیٚ ، عەرعەر لە باخاندا چ باکێکی هەیە ؟.

(أ) لای (ک) نوسراوە : ئیسە هاماچوون ، ئەجەل های هانان .

١ ـ ئەریٚ بینایيم ........
ئەریٚ خاتردار ، مایەی بینایيم

٢ - هامرازی شەوان ، بیدی تەنیايیم
ڕەفیقی ناڵەی سوب سەحەرگايیم

٣ ـ گوشادی خاتر ، پەشیٚویی جەستەم
ڕۆشنیی دیدە ، ئەی ئاوات وەستەم

۴ ـ سەوگەند بەڕیٚزەی خاڵانی ئاڵات
نیەن زیندەگیم ، نەوینو باڵات

۵ ـ ئومیٚدم ئیدەن ، خاتر پەڕەی گوڵ
حەرفی بەدکاران نەگیری نە دڵ *

---

بید = شوێنی چۆڵ . سوب = بەیانی . گوشاد = کراوە . وەستە = خواستو .
سەوگەند = سوێند . نەوینو = نەبینم . ئیدەن = ئەمەیە . حەرف = پیت ، مەبەست قسەیە .

**واتە :** ئەی دڵداری بینایی چاوو مایەی بینینم ، هاوڕازی شەوانەی شوێنی تەنیاو چۆڵم ، هاوڕێی هاوارو ناڵەی بەر بەیانیانم . مایەی کردنەوەی دڵی تەنگ و لەشی پەشێوم ، ڕووناکی چاوی من و ئەی ئاواتە خوازم ، سوێندم بەو وردە خاڵانەی سەر ڕوومەتت ، من ئەگەر باڵات نەبینم ژیانم نیە . هیوام هەر ئەمەیە ئەی شۆخی دڵ وەکو پەڕەی گوڵ کە هەرگیزاوهەرگیز قسەی ناحەزان و خراپەکاران نەگریتە دڵ .

(*) ئەم شیعرە لە دەست نوسەکەی (میم) وەرگیراوە .

١ـ ئیمشەو ئایرێ گڕبەست نە دەروون
بڵێسەش یاوا بە سەقفی گەردوون

٢ـ جە کورەی ئایر، جە بڵێسەی نار
ستێزام چوون بەرق، ئاوکەردم هاوار

٣ـ جە هاوار هاوار شەفاو لاڵەی من
جە هەی ئاو هەی ئاو، شین و ناڵەی من

٤ـ تمەز مەژنەوۆ یەک خودا تەرسێ
موسڵمان صیفەت ڕاگەی حەق پەرسێ (أ)

٥ - ماوەرۆ گۆزەی نەفتی بیت المالْ (ب)
مەشانۆ وەڕووی گڕ بەستەی شەماڵ (ج)

٦ـ پێسە مەزانو یەگۆزەی ئاوەن
نمەزخۆ یە نەفت تەوەن پێ تاوەن (د)

٧ـ گۆزەی نەفتش کەرد وە بڵێسەمدا
قرچەی گۆزەی نەفت وەستێزەم دا

٨ـ هەرتا سەحەر بی، هەر سۆزام بە سۆز
سەحەر سفتەکۆم با بەردش چوون تۆز

**٩ ـ هەر کەس وێنەی من ئیقباڵش چەفتەن**
**نەواچۆ هەی ئاو ، نەصیبش نەفتەن**

- ١٦ -

**١ ـ ئیمشەو جە خاودا زوڵف دێزیٚ دیم**
**چوون سیاماران سەراوێزیٚ دیم**

---

- ١٥ -

**ئایر = ئاگر . یاوا = گەیی . ستێزام = ڕاپەڕیم . بەرق = چەخماخە . مژنەوۆ = ئەبیسێت . ماوەرۆ = ئەیهێنیٚ . بیت‌المال = وشەیەکی عەرەبیە واتە کاڵا وماڵ کە کاتی خۆی لە جێگـەی بـانـکی ئێستە دانـراوە . مـەشـانـۆ = ئەیوەشێنیٚ . پێسە مەزانۆ = وائەزانیٚ . سۆزام = سوتام . سفتەکۆ = خۆڵەمێش ، خۆڵەکەوە . بابەردش = بابردی . نەواچۆ = نەڵیٚ .**

**واتە** : ئەمشەو ئاگریٚ لە دەروونمدا گڕی بەست و بڵێسەی گەشتە سەقفی گەردوون. لە تاوگڕوبڵێسەی ئاگر وەکو چەخماخە ڕاپەڕیم و هاوارم کرد. لە هاوارهاوار و ناڵە و پاڕانەوەی من ، لە هەی ئاو وگریان و زایەڵەی من . لە خواترسێکی موسڵمان ئەیبیسیٚ . گۆزەیە نەوتی بیت المال دێنیٚ و ئەیپژێنیٚ بە ڕووی گڕەکەدا کە بای شەماڵ ئەیگەشێنێتەوە . وا ئەزانیٚ گۆزەی ئاوە ، تمەز نەوتەو ئەوەندەی تر توونەکەی پیٚ تاو ئەدا . گۆزە نەوتەکەی کرد بە سەر بڵێسەکەمدا، قرچە قرچی گۆزەی نەوتەکە ڕایوەشاندم و خستمیە هەلەکەسەما . تا بەیانی هەر بە سۆزەوە ئەسوتام ، بەیانی خۆڵەمێشەکەیشم با وەکو تۆزبردی . هەرکەسیٚ وەکو من بەختی چەوتە، داوای ئاو نەکات نەوتی پیٚ ئەبریٚ .

**(أ) لای (ک) نوسراوە : ڕای حەق پەرسی .**
**(ب) لای (ک) نوسراوە : مەشۆ ماوەرۆ کۆزەی .**
**(ج) لای (ک) نوسراوە : مەشانۆش وەڕووی گڕ بەستەی تاوەن .**
**(د) لای (ک) نوسراوە : کۆی تەوەن تاوەن .**

٢ـ شیام، هۆرم گرت من به نەزانی
نمەز ئەو قاتڵ دەوای گەزانی [أ]

٣ـ تیژتەر جە ئەڵماس قولابش سازا
یەک زەڕەی تەنم ناستش بە ئازا

٤ـ ڕۆح جە تاوییای زامی گیرو گاز
پەرێ ئاسایش ئاما وە پەرواز

٥ـ واتش مەربشون دوورگنون لێشان
زامی گازی مار مەتاووکێشان

٦ـ ئەو دی هەم بەردش سەرنە دەهانم
ڕاگیربی، پەرێ ڕۆحی ڕەوانم

٧ـ ئەو جە ئێشی زام هایلەی قاتڵ
وێش جە پەروازی ئەو کەردەن باتڵ

٨ـ بەی گشت زامەوە شی وەتەنمدا
بەتەنی پڕ دەرد، خەم وەتەنمدا

---

جەخاودا = لە خەودا. سەراویز = سەربەرەو خوار. شیام = چووم. گەزانی = گەستمی. سازا = پێکی هێنا. ناستش = نەیهێشت. بە ئازا = بەساغی، بێ زام. تاویای = توانەوە. ئاما = هات. پەرواز = باڵ گرتنەوە. دوورگنون = دوورکەومەوە. مەتاووکێشان = ناتوانم بکێشم. ئەودی = ئەو دەم. دەهان = دەم. ڕاگیر = ڕێ گر. هایلە = پڕ مەترسی، سامناک. وەتەنی یەکەم = بەلەشی، بەگیانمدا.

١ـ ئیمشەو جەستەی من ..........
ئیمشەو ئەرمەدیش ، کەسیّ جەستەی من

٢ـ حاڵی پەشێویای جەستەی خەستەی من
نائومێد مەبی ، پەریّ جەستەی من

٣ـ دەروون جە دووریی ، مەگریا بە تاو(أ)
جە چەم مەتکیا پەیا پەی هووناو

٤ـناڵەی ناڵینم وەپای عەرش یاوا
ڕوخسارم نەرووی زەمین مەساوا

---



وەتەنی دووەم = ووشەیەکی عەرەبیەو بە ماناى نیشتمانە .

**واتە** : ئەمشەو لە خەودا زوڵفی ڕەشیم بینی ، کە وەکو ڕەش مار شۆڕ بوو بوونەوە . چووم ئەو هەورەم بە نەزانی گرت و دەستم دایە ، ئەو بکوژە دای بە دەستمەوەو گەستمی تیژتر لە ئەڵماس قولاپێکی پێکەوە نا ، تۆسقاڵیّ لە لەشمی بیّ زام و برین نەهێشتەوە . ڕۆحیش لە تووانەوەی ئەو زامە سەختەدا بۆ تۆزیّ ئارامیی کەوتە باڵ لێکدان . ووتی مەگەر بڕۆم و لێیان دوورکەومەوە ، نازانم زەحمەتی گازی مار بکێشم . ئەو کاتەی سەری بردە ناودەممەوە ڕێگەی دەرچوونی لە ڕۆحم گرت . لە ئێشی زامی پڕ مەترسیی ئەو بکوژەدا وازی لە باڵ گرتنەوە هێنا . بەو هەموو دەردو ئازارەوە چوو بەلەشمدا . بەو لەشەی کە پڕ لە ئازارو خەمی نیشتمانە .

(أ) لای (ک) نوسراوە : **شیانی گرتم من جە نەزانی .**
**نمەز ئەو قاتڵ ( ............ )**

٥ـ نەگاهیٚ ڕاحەت ، نەلادیٚ ئارام
تا سوب سپی بی ، بەو تەور ، ویارام

٦ـ کەسیٚ پەی قیبلەش یە ژیانش بۆ
پەیش کەمەن بەی تەور ، ئەرسەد گیانش بۆ

- ١٨ -

١ - ئیمشەو خاری یاو ، زەمانەی ویصاڵ
بەردش بە دڵدا جە دەستی خەیاڵ

٢ - وەختیٚ خار نەتەخت دڵ گیٚرتش قەرار
شکوفتەن[أ] نەڕووم ، گوڵ هەزار هەزار

---

- ١٧ -

مەدیش = ئەی بینی . مەگریا = ئەگریا . مەتکیا = ئەتکا . هوونـاو = خوێناو. مەساوا = ئەیساوی . لادیٚ = تاویٚ . ویارام = بەسەرم برد . یە ژیانش بۆ = ئەمە ژینی بیٚ. پەیش = بۆی

**واتە** : ئەمشەو ئەگەر کەسیٚ لاشەی منی چاو پێئەکەوت ، لەبەر حاڵی پەشێوی لاشەی ماندووم ، نائومێد ئەبوو . دەروونم لە تاو دووری و دابڕان لە یار بە تاو ئەگریاو لە چاویشمدا خوێناو بە بیٚ وەستان ئەتکیا ، دەنگی هاوارو ناڵەم گەشتە عەرش و دەموچاویشم بە زەویدا ئەساوی . نە جاریٚ ڕەحەت ئەبووم و نە تۆزیٚ ئارام ، تا بەیانی ڕۆژ بوویەوە بەو شێوە بە سەرم برد. دیارە کەسێک کە لە پێناوی خۆشەویستەکەیدا ژیانی ئاوابێت ، هێشتا ئەمەیشی بۆ کەمە، ئەگەر سەدگیانیشی پیٚ بیٚ .

(أ) ئەم بەیتەو بەیتی شەشەم ، لای (ک) و (سها) هەیە و لای ئێمە نیە .

**٣ـ جه پەی زامی خار، دەست نیشانی دڵ**
**خەم بی وەگوڵزار، من بیم وە بڵبڵ**

**٤ـ ناڵەی بڵبڵیم بڵند پایە بی**
**جه پەی شووم بەختیم ئایرمایە بی**

**٥ـ جەستەم هەر گریان[ب] تاسوب بەیاندا**
**سوب باڵام نیشان سفتە دڵان دا**

- ١٩ -

**١ـ ئیمشەو دڵ جەدەرد .......**
**تا سوب سپی بی ، هەر[أ] ناڵا جەدەرد**

---

- ١٨ -

**خاری یاو** = درکی تا . (گەرم بوونی لەش بە دەم نەخۆشیەوە). **زەمانەی ویصاڵ** = کاتی بە یەک گەشتن. **بەردش** = بردی. **گرتش** = گرتی. **قەرار** = ئارام. **شکۆفا** = گەشایەوە. **ئایر** = ئاگر. **گریان** = گریا. **سفتە** = سووتاو.

**واتە** : ئەمشەو درکی (تا) لەکاتی بە یەک گەشتن دا چەقی بە دڵداو خەیاڵی بڕی. کاتێ درکە کە لە تەختی دڵدا ئارامی گرت گوڵ بە ڕوومدا هەزار هەزار گەشانەوە. لەو زامی درکە لە دڵدا خەم بوو بەگوڵزار و منیش بە بولبوڵ. دەنگ و هاواری وەک بولبولم بەرزبوو، بۆ بەوبەختیم دەست مایەکەی ئاگربوو. تا بەرەبەیان لاشەم هەر گریاو بەیانی باڵای خۆمم نیشانی دڵ سووتاوەکان دا.

(أ) لای (ک) نوسراوە : شکەفتنا.
(ب) لای (ک) نوسراوە : گریا.

٢ـ پەیوەست مەکێشاش هەناسانی سەرد
هەر سەنگ و ئاهەن، پەیش مەبی وەگەرد

٣ـ واتم هەی دڵە، وەسەن وەس ناڵە
خەڵکان جەناڵەی تۆشان شی زاڵە

٤ـ واتش بێ مرووەت جە مەیل سەردەنی
چەنی نەناڵو، مەر بێ دەردەنی...؟[ب]

٥ـ جەی وەرتەر قیبلەم، هەر شام، هەر سەحەر
مەنماناش باڵای نەمامی نەوبەر[ج]

٦ـ ئیسە لێڵاوی ئەو نەدینمەن
جەوپەی ئاهی سەرد، زاری و شینمەن

٧ـ ئیسە پەی دووری قیبلەم مەناڵوو
گەردی پاو پاڵاش وەمژە ماڵوو[د]

٨ـ یەخەیلێ وەختەن لێم نادیارەن
نە شەوخاوم هەن، نەرۆم قەرارەن

٩ـ کەسێ کە دۆستش نەپێوارش بۆ
چەنی بە شەو خاو، رۆ قەرارش بۆ ؟

١٠ – چوون (بێسارانی) هەر کەس بێ دڵ بۆ
چوون باخچەی بێ ئاو، دایم بێ گوڵ بۆ [هـ]

## ١ - ئیمشەو من گریام ، خەروس کەرد نالین
## سوب ئەو بیٚ نیشان من زوخ(أ)جەبالین

---

- ١٩ -

**نالاٚ = نالاندی . پەیوەست = بیٚ وچان . مەکیشاش = هەلێئەکیٚشا. وەسەن . وەس = بەسەبەس . توٚشان = توٚیان . شی = چوو . زالە = زاور ، زارو . چەنی نەنالو = چوٚن نەنالێنم . مەنماناش = ئەی نواند . نەدینمەن = نەبینینمە . پاوپالاٚش = پل و پیٚ ی . مژە = برژانگ . خەیلیٚ = دەمیٚکە . پیٚوار = نادیار .**

**واتە :** ئەمشەو دل لە تاو دەردو ئازار تا بەرەبەیان هەر نالاندی . بەردەوام هەناسەی ساردی هەلئەکیٚشا و بەردو ئاسنی پیٚ ئەبوو بە توٚز . ووتم ئەی دل بەسە بەس بنالێنە ، خەلک لە هاوارو نالەی توٚ زاوریان چوو . ووتی : ئەی بیٚ ویژدان توٚ لە ئارەزوو دل ساردی، چوٚن نەنالێنم مەگەر توٚ دەردت نەدیوە .؟ لەمەو بەر خوٚشەویستەکەم هەموو بەیانی و ئیٚوارەیەک ئەهات و بالاٚی وەک عەرعەری بوٚ ئەنواندم . ئیٚستا لیٚلاٚیی چاوم داهاتووەو خوٚشەویستەکەم نابینم ، لە بەر ئەوەیە هەناسەی سارد هەلئەکیٚشم و شیوەن و زاری ئەکەم ئیٚستا بوٚدووری خوٚشەویستەکەم ئەنالێنم، توٚزی پل و پیٚ ی بە برژانگی چاوم بمالم . دەمیٚکە دیار نیە و لیٚم ونە ، بوٚیە نە شەو خەوم هەیەو نە روٚژ ئارام . کەسیٚ کەیارەکەی دیار نەبیٚ ، چوٚن بە شەو خەوو بەروٚژ ئارامی ئەبیٚ. هەر کەسیٚ وەکو بیٚسارانی دلخوازی نەبیٚت ، وەکو باخچەی بیٚ ئاو هەمیشە بیٚ گول ئەبیٚ .

**(أ) لای (ک) نوسراوە : دل .**

**(ب) لای (ک) نوسراوە : چەنی مەنالون ، مەربیٚ دەردەنی .**

**(ج) لای (ک) نوسراوە : مەنماناش بالاٚ، قامەت چون عەرعەر .**

**(د) و (ە) ئەم دووبەیتە لە چاپکراوەکەی (ک) وەرگیراوەو لای ئیٚمە نەبوون .**

٢ـگریەی من جە داخ دووری کەسێ بی
ئەو جە دەرد بێباک وەش نەفەسێ بی

٣ـنە سۆزا بە سۆز نە بە دەمەوە
ناما نەپەرساش ئەو بە خەمەوە

٤ـوێنەی بێ دەردان سەر وە خاک خەیاڵ
تا سوب من گریام نەزاناش بە حاڵ

٥ـبێ دەرد بێ دەردیش(ب) ئەو سا دیاردا
ناڵەش بێ پەروا ئاما بە شاردا

---

**خەروس** = کەڵەشێر. **باڵین** = سەرین. **نەبەدەمەوە** = نەهات بە دەنگمەوە. **ناما** = نەهات. **نەپەرساش** = نەی‌پرسی. **نەزاناش** = نەیزانی. **دیاردا** = دیاریدا، دەرکەوت.

**واتە :** ئەمشەو من گریام کەڵەشێریش ناڵەی لێ هەڵسا، بەیانی ئەو بێ ناونیشان و منیش سەرینەکەم زوخاوی بوو. گریانی من لە تاو دووری کەسێک بوو، ئەو ( واتە کەڵەشێر ) هیچ دەردی نەبوو لە خۆشیاندا ئەینالاند. لە گەڵ دەنگی مندا نەسووتا بە سۆز، نەهات و لە دەردەکەشمی نەپرسیەوە. وەکو ئەوانەی کە بێ‌دەردن سەری نایە سەر خاک و خەیاڵ بردیەوە، بەڵام من تا بەیانی هەر گریام و بە حاڵی نەزانیم. بێ‌دەردی‌ی ئەو بێ‌دەردە ئەوکاتە دەرکەوت و روون بوویەوە کە ناڵەو هاواری هەروا بێ پەروا گەیی بە شار.

(أ) لای (ک) نوسراوە : زوخ وباڵین.

(ب) لای (ک) نوسراوە : بێ دەردش.

